


# لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم



ئامادەکردن و وەرگێڕانی:
**ئەیاد فەهمی**

**بەرگی دووەم**



# لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم

بەرگی دووەم

ئامادەکردن و بەکوردیکردنی

ئەیاد فەهمی



## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم/ بەرگی دووەم

ئامادەکردنی: ئەیاد فەهمی

هەڵەگر: حەیدەر ئیبراهیم

بابەت: کورتە رامان

چاپخانە: تاران

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم/٢٠٢١

تیراژ: ٢٠٠٠

ژمارەی لاپەڕە: ١٥٢لاپەڕە

نرخ: ٣٥٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی(١٥٤٢)ی ساڵی ٢٠٢١ی پێدراوە

﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾

پەروەردگارت

وازی لێ نەهێناویت و لێت دڵگیر نەبووە.

## پێشەکیی وەرگێڕ

پاش ئامادەکردن و لەچاپدانی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە و بە هۆی ئەو پێشوازییە گەرمەی لەلایەن خوێنەران و کتێبدۆستانەوە لێی کرا، بیرم لەوە کردەوە هەموو ساڵێک بەرگێکی تری لێ بڵاوبکەمەوە کە هەڵگری هەمان بیرۆکە و پەیام بێت. بە ناوی خودا دەستم کرد بە کتێبەکە و ڕۆژانە چەند وتەیەکم ئامادە دەکرد، جاری وا هەبوو لەدوای خوێندنەوەی دەیان وتە، وتەیەکم هەڵدەبژارد و دەمکردە کوردی، بۆ ئەوەی وتەکان لە دڵەوە بن و بگەن بە دڵ و زۆرترین سوودی بۆ دین و ژینی خوێنەری کتێبەکەیش هەبێت. سپاس بۆ خودا، دوای چەند مانگێک ئەم کتێبەی لێ دەرچوو. هیوادارم ببێتە مایەی سوود و ڕەزامەندیی خوێنەران.

ئەم کتێبەی بەردەستت بریتییە لە کۆمەڵێک کورتەڕامان، کە باسی میهر و لێخۆشبوونی خودای میهرەبان دەکات، هانت دەدات نزا بکەیت، ئومێدت هەبێت بە وەڵامدانەوە، لە ژیان بێئومێد نەبیت و هەمیشە و بەردەوام بگەڕێیتەوە بۆ لای خودا، سکاڵای خەمەکانت لای ئەو زاتە بکەیت و نهێنیی و ڕازەکانت تەنها لای ئەو بدرکێنیت.

لە ڕێی ئەم کورتەڕامانانەوە بۆت دەردەکەوێت هەتا چ ئەندازەیەک پەروەرێنت میهرەبانە بەرانبەرت، چاکە دەهێنێتە ڕێت و خراپەت لێ دووردەخاتەوە و، لە خۆت باشتر کارەکانت بۆ بەڕێوە دەبات.

ئەو وتانەی ناوی نووسەرەکەیم زانیووە، نووسیومە، ئەوانەشی بێ ناو بوون، وەک خۆی وتەکەم داناوەتەوە، واتە بە ئەنقەست ناوی هیچ نووسەرێکم لانەداوە.... وەک ئەمانەتیی گواستنەوەش بەشێکی وتەکانی ئەم کتێبە ئەو کورتە وتانەیە کە (ئەدهەم شەرقاوی) ڕۆژانە لە واڵی خۆی دایناون. واتە ئەوەی لەم کتێبەدا نووسینی خۆمە تەنها ئەم پێشەکیەیە، ئەوەی تری تەنها وەرگێڕانم بۆیان کردووە.

ئەم کتێبە دیارییەکی بچووکە لە منەوە بۆ خوێنەرەکانم؛ بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەیش هەموو دەم هاوکارمن، جا بە دەستخۆشی بێت یان بە نزایەک لە پەنهانیدا، هانیان داوم لە وەرگێڕان بەردەوام بم. هیوادارم دیارییەکی بەپێز و بەچێژ و سوودبەخش بێت بۆ هەموو ئەو کتێبدۆستانەی کاتی بەبەهای خۆیان بۆ خوێندنەوەی تەرخان دەکەن و، تەنها لەسەر ڕەفەی کتێخانەکانیان داینانێن بۆ ئەوەی دیمەنێکی جوانی پێ ببەخشێت، بەڵکوو لە وتەکانی ناوی ڕادەمێنن و لە هەر سات و جێیەکدا بن چاوەڕێی میهر و سۆزی پەروەرێنیانن.

- **ئەیاد فەهمی سەنگاوی**

(١)

گەر خودا ئاراستەی کەشتییەکەتی بۆ لای ڕاست گۆڕی،

تۆش پێت ناخۆش بوو و خەمبار بووی پێی،

باش بزانە لەلای چەپ تیاچوون و خەسارەتمەندیت دەبوو!

***

(٢)

شێخ شەعراوی دەیفەرموو:

هەر ناڕەحەتییەکەم تووشبووە, ئیللا وتوومە خێرێکی تێدایە.

هەر ڕۆژێکی ناخۆش هاتووەتە ڕێم، ئیللا وتوومە سبەی جوانترە.

هەر شتێکم لەدەست داوە، وتوومە خودا قەرەبووم بۆ دەکاتەوە.

(٣)

لە مەترسییەکانی ژیانکردن لە نێوان تاوان و گوێڕایەڵیدا،
ئەوەیە کە نازانیت عاقیبەتت چۆن دەبێت!
ئامان فریشتەی ڕووحکێشان نەیەت و،
لەو دەمەدا لە سەرپێچی خودادا بیت!

***

(٤)

هەر کەسێک خودا پێش بخات بەسەر کەسانی تردا،
ئەوا خوداش پێشی دەخات بەسەریاندا!

(٥)

گەر خودا ویستی لە شتێک هەبوو،
یاساکانی سرووشتی بۆ پەکدەخات.
لەو دەمەدا،
ئاو ناخنکێنێت،
ئاگر ناسوتێنێت،
شاخ ناپارێزێت،
کچۆلە بەبێ مێرد دووگیان دەبێت و،
پیرێکیش منداڵی دەبێت.

**کەوایە بە هیچ شتێک مەڵێ مەحاڵە،**
**بێگومان خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە!**

***

(٦)

هەر یەکێک لە ئێمە بە شتێک تاقیکراوینەتەوە،
دونیا بە پڕی و سافی بە کەس نەبەخشراوە!
گەر بەڵا و ناڕەحەتییەکان نەبوونایە،
خەڵکی ڕوویان دەکردە دونیا و، بەهەشتیان لە یاد دەکرد.

خەڵکی لە کاتی لەشساغیدا یەکسانن،
ئەوە بەڵا و ناڕەحەتییەکانە جیایان دەکاتەوە!

•••

(٧)

﴿إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ﴾
بەڕاستی پەروەردگارم زۆر نزیکە و دوعاوەرگرە.

(٨)

سەختی و نارەحەتییەکان،

فێری ئەوەت دەکەن، تەنها خودات لەپشتە!

***

(٩)

- مامۆستا گیان، چۆن بزانم لەو کەسانەم کە خودا خۆشیانی دەوێت؟

- گەر خودا خۆشینەویستیتایە، خۆشەویستییەکەی نەدەبووە خەمت!

***

(١٠)

هەموو ئاواتە دوورەکان،
بە نزاکردن نزیک دەبنەوە!

***

(١١)

بینیم سارێژ بوون!
وتم: پەروەردگارا دڵی منیش.

***

(١٢)

- کەمێک دەستت بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە!
- بەڵام زۆر دوعام کرد!
- چیت وت؟
- وتم: خودایە تەنها خۆت دەیزانیت!

***

## (١٣)
## پاساکان

ئەو کەسەی بەردەوام سوپاس و ستایشی خودا (الحمدلله) بکات،
خێر و چاکە دەڕژێت بەسەریدا.
ئەو کەسەی بەردەوام داوای لێخۆشبوون لە خودا (أستغفرالله) بکات،
دەرگا داخراوەکانی بۆ دەکرێتەوە!

ئەو کەسەی لە کاتی خۆشیدا خودای لە یاد بێت،
خودا لە کاتی ناڕەحەتی و سەختیدا فریای دەکەوێت و لە یادی ناکات!

ئەو کەسەی بەردەوام سەڵاوات لێ دەدات،
خودا لە تاوانەکانی خۆشدەبێت و، لە خەم بە دووری دەکات!
ئەو کەسەی پشت بە خودا ببەستێت، ئەوا خودا بەسیەتی.
ئەو کەسەی تەقوای خودای هەبێت، بەبێ شوومار ڕۆزی دەدات.

(١٤)

﴿إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾

بەڕاستی پەروەردگارم بیسەری دوعا و پاڕانەوەیە.

***

(١٥)

گەر خودا بەندەیەکی خۆشویست،

دواتر بینی وا دووردەکەوێتەوە لێی،

بە پەتی بەلا و نارەحەتییەکان ڕایدەکێشێتەوە، هەتا بگەڕێتەوە بۆ لای!

***

(١٦)

تەواو باوەڕم وایە کە،
بەخشینت حیکمەتە،
گرتنەوەت حیکمەتە،
ئەو بەڵایانەی دێنە ڕێمان بۆ حیکمەتێکە.
پەروەرێنە،
گەر حیکمەتەکانتم لێ شاراوە بوون،
لە ڕازیبوون بە بڕیارەکانت بێبەشم مەکە!

***

(١٧)

کارەکە لەلای خوداوە دەست پێ دەکات و،

لەلای ئەو زاتەش کۆتاییی پێدێت،

هەر بۆیە لە بەر دەرگای کەسدا ڕامەوەستە!

***

(١٨)

مەیمونی کوڕی میهران دەیفەرموو:

سەدەقە دەکەم و، دەبینم سامانەکەم هەر زیاد دەکات!

دواتر هاوڕێکەی خێرێکی کرد و پێی وت:

بەڵام من خێرم کرد و سامانەکەم کەمی کرد!

فەرمووی: من بە یەقینەوە مامەڵە لەگەڵ خودادا دەکەم و،

تۆش بە گومانەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکەیت!

***

(١٩)

گەرچی بە ئەندازەی تاڵەموویەک لە ئاواتەکانت دووربیت،

پێی ناگەیت،

مادەم حیکمەتی خودا لەوەدایە کە پێی نەگەیت....

گەرچی نێوان تۆ و ئاواتەکانت،

هێندەی دووریی ئاسمان و ڕێسمانیش بێت،

پێی دەگەیت،

مادەم ویستی خودا لەوەدایە پێی بگەیت،

جا چەندێ دوور و مەحاڵیش بێت!

***

(٢٠)

﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ﴾

واتە: ئومێدم وایە پەروەردگار هەموویانم بۆ بهێنێتەوە و بە هەموویان شاد ببم!

باوەڕدار هەمیشە یەقینی وایە،

خودا لەگەڵ خۆشەویست و ئازیزانی جەمی دەکات،

خەونە بڵاوەکانی بۆ بەدیدەهێنێت و،

ئاواتە دوورەکانی لێ نزیک دەکاتەوە!

***

(٢١)

﴿وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا﴾

پەروەردگارم،

هەرگیز لە پاڕانەوەم لێت بێهیوا نەبووم (دەستت نەناوە بەڕوومدا).

***

(٢٢)

﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ﴾

واته: خۆشەویستیم ڕژاند بەسەرتدا، تا لەژێر چاودێریی مندا .گەورە ببیت.

**ئەو دەمەی کەسێکت خۆشدەوێت، گرنگی پێ دەدەیت،**

**بەڵام کە خودات خۆشویست، ئەو گرنگیت پێ دەدات.**

کە خودا خۆشیویستیت،

هیچ کەسێک زیاتر لەو خۆشیناوێیت.

کە خودا پێی بەخشیت،

هیچ کەسێک زیاتر لەوت پێ نابەخشێت.

گەر لێت توورەبێت، کەس لەدەستی دەربازت ناکات!

کێت هەیە جگە لە خودا؟!

لەگەڵ خودا بە، هەموو جیهان لەگەڵت دەبێت.

(٢٣)

﴿وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾

**واتە: هۆی چاککردنەوەی دیوارەکەش ئەوەیە، چونکە هیی دوو منداڵی هەتیو بوو لە شارەکەدا....**

لەوەیە لەو کاتەدا منداڵەکان خەوتبن،

یان یارییان کردبێت،

(خزر)یش لەو کاتەدا دیوارەکەی بۆ چاکدەکردنەوە!

پشت بە پەروەردگارت ببەستە،

سەربازەکانی کارەکانت بۆ بەڕێ دەکەن،

بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەیت!

***

(٢٤)

ئێمەش لاواز دەبین، نەک لەبەر لاوازیی ئیمانمان،
بەڵکوو بەهۆی ڕەقیی و توندیی دونیاوە.......
لە ڕۆژی تائیفدا، پێغەمبەری خودا ﷺ ئیمانی لاواز نەبوو،
بەڵکوو دونیا بەرانبەری توند بوو.......

خودا ئەندازەی ئازار و دڵشکانەکەی دەزانی،
سەرکۆنەی نەکرد لەبەر ئەوەی خەمبارە!
پێی نەفەرموو: ئەی کوا ئیمانەکەت؟!
بەڵکوو فریشتەیەکی بۆ نارد، سەریبخات و داڵدەی بدات!

خودا دەیزانی لە کۆتاییدا پێغەمبەریش ﷺ مرۆڤە،
مرۆڤەکانیش بە ساتانێکدا تێدەپەڕن،
پێویستیان بە دڵێکی بەسۆز هەیە،
نەک بیریارێک و زمانی وتاربێژێک.....!

ئەدهەم شەرقاوی

(٢٥)

سابت وتی: ئەی ئەنەس، بە دەستی خۆت،

دەستت دا لە دەستی پێغەمبەری خودا ﷺ؟!

وتی: بەڵێ!

وتی: دەستت بێنە با ماچی بکەم!

***

(٢٦)

﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾

پەروەردگارت وازی لێ نەهێناویت و لێت دڵگیر نەبووە.

***

(٢٧)

یەکێک لە پیاوچاکان فەرمووی:
سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوداﷺ
چاکەکردنە لەگەڵ دایک و باوکدا!

پرسییان: چۆن؟
فەرمووی:
چونکە فریشتەکان سڵاوەکەی دەگەیەنن بە پێغەمبەری خوداﷺ،
دەڵێن: فلانی کوڕی فلان سڵاوی لێ کردوویت...

هۆکارێک بیت لەلای ئەو باسی باوکت بکرێت،
جۆرێکە لە چاکەکردن لەگەڵیاندا....

***

(٢٨)

لە گەورەترین داواکارییەکانی دونیا:

"بەدووربوونە لە خەم."

لە گەورەترین داواکارییەکانی دوارۆژ:

"لێخۆشبونە لە تاوانەکان."

سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ

هەردووکیت پێ دەبەخشێت:

لە خەم بەدوورت دەکات و دەبێتە هۆکاری لێخۆشبوونیشت!

***

(٢٩)

گەڕانەوە بۆ لای خودا،
لە کاتی جەنگ و نەخۆشی و ترس و بەڵادا،
پێی ناوترێت دووڕوویی،
بەڵکوو ئیمان و گومانی باش بردنە بە خودا!

گەر مرۆڤ لەم کاتانەدا پەنا بۆ پەروەردگاری نەبات،
ئەی چ کاتێک پەنای بۆ دەبات!

پاک و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی ڕێنوێنی کردووین کە:
﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ﴾ بەپەلە بەرەو لای خوا بڕۆن!

(٣٠)

﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ﴾

واتە: پاشان ڕێگای (چاک و خراپی) بۆ ئاسان کردووە!

ئەسڵ لە هەموو ڕێگاکانی ژیاندا ئاسانییە،
ناڕەحەتی و قورسییەکان کاتیین و تێدەپەڕن.

خودا دڵە شکاوەکەت ساڕێژ دەکات،
پەروەردگاری وازیکاری هەموو شتێک،
ڕێگا داخراوەکانت بۆ وازی دەکات.

کارە لارەکانت ڕێک دەبنەوە،
ئازارەکانت نامێننن و،
دڵتەنگییەکەت دەبێتە دڵخۆشی.

بزانە خۆت و دڵت موڵکی خودان،
با دڵت ئارام بێت!
پەروەردگارا، ئاسانکاریمان بۆ بکە،
هەموو کارێکی گرانمان بۆ ئاسان بکە.

(٣١)

﴿قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ﴾

واتە: خێزانی ئیبراهیم وتی: وەی ڕۆ (شەرمەزار خۆم)! چۆن منداڵم دەبێت! من پیرم و ئەمەش مێردەکەمە، پیر و بەساڵاچووە، بەڕاستی ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە!

**لەگەڵ خودادا،**

**ئاواتەکانت بە گەورە مەزانە،**

**ئەو خودای مەحاڵەکانە!**

***

(٣٢)

﴿وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾

بێگومان خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

***

(٣٣)

﴿وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ﴾

هەر ئەویش زاتێکی زۆر لێخۆشبوو و بەسۆز و دلۆڤان و دڵسۆزە!

بڕوانە ئەم وردەکارییە جوانە، (الـودود)ی بەستەوە بە (الغفور)ەوە، بۆ ئەوەی دەلالەت بکات لەوەی گەر تەوبەیان کرد و گەڕانەوە بۆ لای خودا، خودا لێیان خۆشدەبێت و خۆشی دەوێن!

(الودود) واتە، بە جۆرێک خۆشەویستانی خۆی خۆشدەوێت کە لە خۆشەویستیی هیچ کەسێک ناچێت!

***

(٣٤)

گەر بینیت خەڵکی پێت سەرسام بوون،
باش بزانە بە جوانییەک سەرسامن کە خودا دەریخستووە.
ئەو ناشرینییە نازانن کە خودا بۆی پۆشیویت،
سوپاسگوزاریی خودا بە و مەغرور مەبە!

***

(٣٥)

﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾
پەروەردگارم هیچی لێ ون نابێ و، هیچی لە بیر ناچێ.

***

(٣٦)

ترۆپکی بەخششی خودا بەختەوەری نییە،

بەختەوەری هەستێکی کاتییە و دەڕوات.

ترۆپکی بەخششی خودا، ڕازیبوونە.

خودا بە پێغەمبەری ﷺ نە فەرموو:

ولسوف يعطيك ربك فتسعد

بەڵکوو فەرموویەتی:

﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ﴾

واتە: لە ئایندەدا پەروەردگارت ئەوەندە ناز و نیعمەتت پێ دەبەخشێت، کە زۆر پێی ڕازی و خۆشنوود دەبیت.

***

(٣٧)

گەر یەکێک پێی وتی: "دوعام بۆ بکە!"
ئەوا بزانە ژیان دڵی ناڕەحەت کردووە،
بە تەنیا جێی مەهێڵە!

***

(٣٨)

شۆکبوونەکەت لە نوێژی ئیستخارەدا دابنێ،
خولیاکانت لە شەونوێژدا،
تاوانەکانت لە نوێژە فەرزەکاندا و،
کەمتەرخەمییەکانیشت لە نوێژە سوننەتەکاندا!

***

(٣٩)

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾

هەردەمێ بەندەکانی من پرسیاریان لێ کردیت دەربارەی من،
ئەوا بێگومان من لێیانەوە نزیکم،
گیرا دەکەم نزای نزاکاران، هەر دەمێک هاوار و نزام لێ بکەن!

***

(٤١)

**پێغەمبەری خوداﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە:**

﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾

**واتە: جا ئەگەر ئەشکەنجەیان بدەیت، ئەوە بەڕاستی بەندەی خۆتن و، ئەگەر لێشیان خۆشبیت، ئەوە بەڕاستی خوایەکی باڵادەست و دانایت.**

**دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی:**

**پەروەردگارا، ئوممەتەکەم، ئوممەتەکەم! گریا...!**

**خودا فەرمووی: ئەی جبریل، بچۆ بۆ لای موحەممەد و پێی بڵێ:**

**لە ئوممەتەکەتدا ڕازیت دەکەین و شەرمەزارت ناکەین!**

***

(٤٢)

بە دوودڵییەوە مامەڵە لەگەڵ خودادا مەکە،

بە یەقینەوە مامەڵەی لەگەڵ بکە،

بۆ ئەوەی بە موعجیزە مامەڵەت لەگەڵ بکات!

- شەعروای

***

(٤٣)

شتێک ئازارت دەدات؟

هاوار بکە خودا، شیفا تەنها لای خودایە!

شتێکت لەدەست داوە؟

هاوار بکە خودا، قەرەبووی جوان تەنها لای خوداوە دێت!

دڵت شکاوە؟ بێتاقەتیت؟

هاوار بکە خودا، تەنها خودا دڵە شکاوەکەت سارێژ دەکات!

گەر هاوار بکەیتە خودا،

هەموو تاڵییەکانی ژیانت بۆ دەگۆڕێت بە خۆشی!

***

(٤٤)

﴿رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾

واتە: پەروەردگارا، بەڕاستی تۆ خێر و بێری زۆرت بەسەردا ڕژاندوم، بەڵام هێشتا هەژارم و ئاتاجی بەخششی زیاترم.

هیچی نەبوو!

پێویستی بە خواردن و خواردنەوە و ماڵ و هاوسەر و ئارامی هەبوو، تەنها یەک دوعا هەموو ئەوانەی پێ بەخشی!

***

(٤٥)

﴿فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾

بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەند و بێنیازە.

***

(٤٦)

- تاوانم زۆرە.
- ئەو لێخۆشبووە.
- ناشرینم.
- ئەو جوانە.
- دوورم.
- ئەو نزیکە.
- دەمەوێ نزیک ببمەوە.
- نوێژ بکە.
- لەسەر دڵم قورسە.
- نوێژ سانای دەکات.
- جەستەم قورسە.
- نیەت سووکی دەکات.
- نیەت بەسە.
- ئەو پەروەردگاری نیەتەکانە.
- من لاوازم.
- ئەو بەهێزە.

- دڵم شکاوە.
- سارێژی دەکات.
- گەر تەوبەم شکاند.
- دووبارە تەوبە بکە.
- ئەی گەر دیسان شکاندم؟
- بگەڕێوە بۆ لای، هەتا ئەو دەمەی ڕووحت دەگەڕێتەوە بۆ لای.
- ئەو میهرەبانە.
- کەواتە بێزار مەبە.
- ئەو مەزنە.
- کەواتە سەرپێچی مەکە.
- لە کوێ بۆ خودا بگەڕێم؟
- لە دڵتدا بۆی بگەڕێ، دەیدۆزیتەوە.
- مادەم خودای تێدایە، بۆچی سەرپێچیی دەکەم؟!
- بۆ ئەوەی تەوبە بکەیت.
- چی لە تەوبەدا هەیە؟
- خودا پێی خۆشە.

- خودا خۆشیدەوێم؟

- خۆشیدەوێیت.

- بەڵام سەرپێچی دەکەم.

- بەڵام تەوبە دەکەیت.

گەر خۆشینەویستیتایە،

دڵتی بە ئاگا نەدەهێنایەوە بۆ ئەوەی تەوبە بکەیت!

***

(٤٧)

﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥۖ﴾

ئایە خودا بەس نییە بۆ بەندەکەی؟!

***

(٤٨)

زۆر لەگەڵ دایکیدا نەژیا،

نەیزانی سۆزی باوک چۆنە،

برایەکی نەبوو پشتیوانی بێت،

میهرەبانیی خوشکی نەبینی!

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا،

ڕەحمەت بوو بۆ هەموو جیهانیان:

مرۆڤ و ئاژەڵ و درەخت.....

جوانترین و گەشترین ڕووی هەبوو،

خاوەنی بەرزترین ڕەوشت بوو.

﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾

***

(٤٩)

ئەو دەمەی لە بەڕائی کوڕی عازبیان پرسی:
ئەرێ ڕووی خۆشەویست ﷺ وەک شمشێر وابوو؟
فەرمووی: نەخێر.....بەڵکوو وەک مانگ وابوو!

***

(٥٠)

دوعا پشتی مەحاڵەکان دەشکێنێت،
زۆر داوا بکە و بێزار مەبە!

***

(٥١)

﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ﴾
خودا بەسەر کاری خۆیدا زاڵە.

(٥٢)

بەراوردێکی سادە ئەنجام بدە:

بەراوردی نێوان ئەو نیعمەتانە بکە کە پێت بەخشراون،

لەگەڵ ئەو نیعمەتانەی پێت نەبەخشراون!

بەراوردی ئەو ڕۆژانە بکە کە لەشساغ بوویت،

لەگەڵ ئەو ڕۆژانەی نەخۆش بوویت!

ئینجا بۆت دەردەکەوێت تۆ براوەیت!

***

(٥٣)

**گەر خودا ئەو شتەی لێ سەندیتەوە،**

**کە پێشبینیی لەدەستدانیت نەکردبوو،**

**شتانێکت پێ دەبەخشێت،**

**کە هەرگیز بە خەیاڵتدا نەهاتووە پێت ببەخشێت!**

***

(٥٤)

دروستە لە نێوان سوجدەکاندا بڵێین:

(اللَّهُمَّ اغفِر لي وارحَمني **واجبُرني** وارزُقني وارفَعْني)

واتە: خودایە، لێم خۆش بە، ڕەحمم پێ بکە، سارێژم بکە، ڕۆزیم بدە و، بەرزم بکەرەوە.

**(سارێژم بکە)**

وەک ئەوەی ڕۆژانە زۆر دەشکێین،

پێویستمان بەوەیە خودا سارێژمان بکات!

***

(٥٥)

هەندێ جار،

گەڕانەوەت بۆ لای خودا،

لەوەوە دەست پێ دەکات کە کەسێک دڵت دەشکێنێت،

یان کەسێکی نزیکت خیانەتت لێ دەکات،

هەتا بێئومێد دەبیت لە مرۆڤەکان و پەنا دەبەیتە بەر خودا،

ئەویش بێ پێویستت دەکات لە هەموو جیهان!

***

(٥٦)

ئەو دەمەی یەعقوب فەرمووی:

﴿وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ﴾

واتە: دەترسم گورگ بیخوات.

**یوسف و بینایی لەدەست دا!**

ئەو دەمەی فەرمووی:

﴿أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾

واتە: باسی سکاڵا و غەم و پەژارەم هەر بۆ لای خوا دەبەم.

**یوسف و بیناییەکەی بۆ گەڕایەوە!**

***

(٥٧)

له كاتی بانگی بەیانیدا دوو بژاردەت هەیە:
بخەویت بۆ ئەوەی خەوەكەت تەواوبكەیت یان،
هەستیت بۆ ئەوەی خەونەكانت بێنەدی!

***

(٥٨)

گەر خودا لە شوێنێکدا دایناێت و،

دەتتوانی ئاسانکاری بۆ خەڵکی بکەیت،

ئاسانکارییان بۆ بکە.

وەڵڵاهی نازانی دوعای یەکێکیان چ کارێکت بۆ دەکات!

کێ ناڵێ لە نێوان ئەوانەدا، کەسێکی تێدا نییە

گەر سوێند بخوات لەسەر خودا، خودا داواکەی بۆ جێبەجێ دەکات!

***

(٥٩)

﴿فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلۡأَوَّٰبِينَ غَفُورٗا﴾

واتە: خودا بۆ تەوبەکاران و پەشیمانان زۆر لێخۆشبوو و بەخشندەیە.

(الأوَّاب)

ئەو کەسەیە تاوان دەکات، دواتر داوای لێخۆشبوون دەکات.

تاوان دەکات، داوای لێخۆشبوون دەکاتەوە.

تاوان دەکات، داوای لێخۆشبوون دەکاتەوە.

تاوان دەکات، داوای لێخۆشبوون دەکاتەوە.

**هەتا خودا دەفەرموێت:**

**بەندەکەم زانی پەروەردگارێکی هەیە،**

**لە تاوان خۆشدەبێت و بە هۆی تاوانیشەوە سزا دەدات،**

**هەر بۆیە منیش لێی خۆشبووم.**

***

(٦٠)

﴿وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْۗ﴾

واتە: دەبا لێبووردە بن، دەبا چاوپۆشی بکەن.

مەسعودی کوڕی موحەممەدی هەمزانی،

کەسێکی زۆر باش بوو، کەسێکی زۆر لێبووردە بوو.

خەڵکی دەبووری و دەیوت: ڕابردوو باس ناکرێت!

لەدوای مردنی لە خەوندا بینییان و، لێیان پرسی:

خودا چۆن مامەڵەی لەگەڵدا کردیت؟

وتی: لە بەردەمیدا وەستام و فەرمووی:

ئەی مەسعوود، ڕابردوو باس ناکرێت.

بیبەن بەرەو بەهەشت!

(٦١)

﴿فَلَوۡلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُسَبِّحِينَ لَلَبِثَ فِي بَطۡنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾

واتە: خۆ ئەگەر لەو کەسانە نەبوایە کە تەسبیحات و یادی خوا دەکەن، تا ڕۆژی زیندووکردنەوە لە ناو سکی نەهەنگەکەدا دەمایەوە.

لە کاتی ئارامیدا خودای لە یادبوو،
خوداش لە کاتی نارەحەتیدا لە یادی نەکرد،
هیچ کەسێک هێندەی خودا بەوەفا نییە.

***

(٦٢)

ئەم ڕووحەی لە نێوان سەرپێچی و گوێڕایەڵیتدا دێت و دەچێت،
ڕووحێکی نموونەیی نییە،
بەڵام خۆشیدەوێیت خودایە!

***

(٦٣)

لەوەیە ئەو دەمەی دەخەویت لە کارێک بێئومێد بوو بیت،
بەڵام کە ڕۆژ دەبێتەوە، دەبینیت دەرووت لێ کراوەتەوە!

***

(٦٤)

خەم و ئازارەکانت فڕێ بدە پشتەوە و،
لێگەڕێ خودا سارێژی برینەکانت بکات!

بیرت بێت: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا﴾
خودا، توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە!

***

(٦٥)

دیاریکردنی نەخۆشی:

﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ﴾

واتە: سوێند بە خوا ئێمە چاک دەزانین کە،

بەڕاستی دڵت تەنگ دەبێت بەو گوفتارە نابەجێیەی کە پێت دەڵێن.

چارەسەرەکەی:

﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾

واتە: جا تەسبیحات و سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکە و،

لە ڕیزی سوژدەبەراندابە.

***

(٦٦)

خەڵکی ستایشت دەکەن، چونکە خودا دایپۆشیویت!

فەزڵەکە هیی ئەو زاتەیە دایپۆشیویت، نەک ئەوەی ستایشی کردوویت!

***

(٦٧)

متمانەت هەبێت،

خودا زۆر بەسۆزترە لەوەی دڵە خەمبارەکەت لە یاد بکات.

زۆر لەوە بەخشندەترە خەمەکانت درێژە بکێشن و،

خۆشی نەهێنێتە ڕێت.

خودا زۆر لەوە مەزنترە هیوایەکت تێدا بخولقێنێت، پاشان بیمرێنێت.

خودا لە خەمەکانت گەورەترە!

**ڕۆژێک دێت دەڵێیت:**

**خودا بە جۆرێک دڵی ساڕێژ کردم،**

**هەرگیز خەونم پێوەی نەدەدی!**

***

(٦٨)

مووسا فەرمووی: ئەوە گۆچانەکەمە، خۆمی بەسەردا دەدەم!

خودا فەرمووی: دەی فڕێی بدە، ئەی مووسا!

***

(٦٩)

ئاواتەخوازم پێغەمبەری خودا،

دەست بخاتە سەر سینگم و دوعام بۆ بکات و پێم بڵێت:

ئەمە دونیایە، دیدەنیمان بەهەشتە، خەمبار مەبە!

***

(٧٠)

عائیشە دەفەرموێت:

گەر کەسێکتان داوای لە خودا کرد، با داوای زۆر بکات، چونکە داوا لە پەروەردگاری دەکات.

***

(٧١)

**بەجوانی مافی نوێژەکەت بدە،**
**دواتر داوای هەموو مافەکانت بکە....**

***

(٧٢)

پەروەردگارا،

پەیامەکانم زۆرە بۆت،

زۆر لەوەش بەخشندەتریت کە بە بەتاڵی بیانگەڕێنیتەوە.

***

(٧٣)

﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ﴾

لە ئایندەدا پەروەردگارت ئەوەندەت ناز و نیعمەتت پێ دەبەخشێت، کە زۆر پێی ڕازی دەبیت.

***

(٧٤)

ئاممان نەکەی لە ئارامگرتن بێزاربیت،
گەر خودا ویستی لێ بێت لە چاوتروکانێکدا ئاواتەکانت دەهێنێتە دی،
ئەسرین و گریانەکەتی لێ شارەوە نییە،
دەستەوسان نییە خۆت و دۆخەکەت چاک بکات،
لێ ئەوانەی خۆشدەوێت بە ئیلحاحەوە داوای لێ دەکەن.
ئەی نەیفەرمووە: ﴿إِنِّي جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾
واتە: بێگومان ئەمڕۆ من پاداشتم داونەتەوە، بەهۆی ئەوەوە کە خۆگر بوون، بە ڕاستی هەر ئەوانیش سەرکەوتوو و سەرفرازن!

ئارام بە!.......قەرەبووکردنەوەکەت سەرسوڕهێنەر دەبێت!

***

(٧٥)

خودا هەموو ڕێگاكان داناخات،

دڵنیا بە هەندێ ڕێگا هەیە، هێشتا نەتگرتوونەتە بەر!

***

(٧٦)

﴿رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ﴾

﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ﴾

﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ﴾

﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ﴾

﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا﴾

قەتادە دەفەرموێت:

وەڵڵاهی بەردەوام دەڵێن، **"رَبَّنَا رَبَّنَا"** هەتا وەڵامیان دەدرێتەوە.

(٧٧)

ئەی فاتیمە،

ئارام بگرە لەسەر تاڵی و ناڕەحەتییەکانی دونیا،

بۆ نیعمەتەکانی دواڕۆژ!

- سەردارمان موحەممەد ﷺ

***

(٧٨)

- ئەو نیعمەتەت پێ بڵێم گەر ئەو نەبێت هەموو نیعمەتەکان نامێنن؟

- داپۆشینی خودا!

پەروەرێنە، داپۆشینی خۆتمان لێ هەڵنەگریت!

***

(٧٩)

دەڵێن:

تەنانەت بیرکردنەوە لە تەوبە، بە تەوبە هەژمار دەکرێت!

خودایە بە ڕەحمەتەکەت شەرمەزارت کردووین!

***

(٨٠)

**خودا وەڵامت دەداتەوە و،**

**چیرۆکی سارپێژبوونەکەت دەبێتە هیوا بۆ کەسانی تر!**

***

(٨١)

**خودایە، ئەمجارە داوای هیچ شتێکت لێ ناکەم،**

**بەڵکوو سوپاست دەکەم لەسەر هەموو ئەو نیعمەتانەی پێت بەخشیوم!**

***

(٨٢)

تەنها بەهۆی هەڵەیەکەوە،
خەڵکی هەموو ڕابردووە جوانەکەت دەسڕنەوە.
خوداش هەموو ڕابردووە ناشرینەکەت،
بە تەوبەیەکی ڕاستگۆیانە دەسڕێتەوە،
کامەیان شایستەی ئەوەن هەوڵبدەی لێت ڕازی بن!

- موحەممەد متەوەلی شەعراوی

***

(٨٣)

شێخ شەنقیتی دەڵێت:
ئەو دەمەی ئیمانت دابەزی و،
تەمەڵیت دەکرد لە پەرستشدا، دەست بەم دوعایەوە بگرە:
"خودایە بەدبەخت و بێبەشم نەکەیت!"
"اللهم لا تجعلني شقياً ولا محروماً"

(٨٤)

گەر خودا بەندەیەکی خۆشویست،

حەقیقەتی کەسانی چواردەوری بۆ دەردەخات!

***

(٨٥)

**خەڵکی لە باسکردنی خەم و گرفتەکانی ژیانیان جیاوازن**

**بەڵام....**

**ئەو کەسەی لە دوعا و سوجدەدا بۆ خودای باس دەکات،**

**باشترین ڕێگای هەڵبژاردووە!**

***

(٨٦)

پەروەردگارا یارمەتیم بدە،

نەدەم لە دەرگایەک کە بۆ من نەکراوە!

هەوڵی کردنەوەی شتێک نەدەم کە کلیلەکەیم لەلا نییە!

مەهێڵە رووحم پەیوەست بێت بە شتێکەوە کە هیی من نییە!

رازیم بکە بەوەی ویستت لێیە و پێت بەخشیوم،

وام لێ بکە تەنها موحتاجی بەر قاپیەکەی تۆ بم!

***

(٨٧)

﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾

واتە: پەروەردگارت وازی لە تۆ نەهێناوە و لێت دڵگیر نەبووە!

**بەڕاستم بزانە،**

**بەردەوام لەژێر چاودێریی خودادایت و ئاگای لێتە...**

(٨٨)

﴿وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦۚ﴾

واتە: ئەگەر خودا خێر و خۆشییەکی بوێ بۆت،

ئەوە هیچ کەسێک نییە ببێتە ڕێگری!

لەگەڵ ئەو بە،

لەبەر دەرگاکەی بوەستە،

داوای لێ بکە،

چونکە ئەو زاتە ناهێڵێت هیچ شتێک ڕێگری لە فەزڵەکەی بکات!

(٨٩)

- وا مەزانە تەنهایت،

بەردەوام خودا لەگەڵتە.

متمانەت بەم سێ شتە هەبێت:

**هیچ کەسێک لە خودا میهرەبانتر نییە بۆت.**

**هیچ کەسێک هێندەی خودا گرنگی بە خەمەکانت نادات.**

**تەنها خودا دەتوانێت زیانت لەسەر هەڵبگرێت.**

بێئومێد مەبە، خودا لەگەڵتە!

***

(٩٠)

لەدوای چەندینساڵ بۆت دەردەکەوێت،
ئەو دەمەی خودا ئەو شتەی لێ گرتیتەوە کە زۆر خۆشتدەویست،
تەنها بۆ ئەوە بووە بە جوانتر لەوە قەرەبووت بۆ بکاتەوە و،
دڵت ڕازی بکات. متمانەت بە خودا هەبێت.

***

(٩١)

گەر هەستت کرد ڕووحت لە خودا دوورە،

بۆ ساتێک بووەستە و، دەستی ڕاستت بخە سەر دڵت و بڵێ:

**ئەی ئەو زاتەی لە دوارۆژدا کۆمان دەکەیتەوە،**

**ئارامی و خۆشنوودی و دڵخۆشیم بۆ کۆبکەیتەوە،**

**پەروەرێنە کە دەبینیت لێت دووردەکەومەوە،**

**بە جوانترین شێوە بمگەڕێنەوە بۆ لای خۆت!**

***

(٩٢)

هەموو شتێک گەر وازی لێ بهێنیت دەپوکێتەوە،

تەنها قورئان نەبێت گەر وازی لێ بهێنیت خۆت دەپوکێیتەوە!

***

(٩٣)

بنوارە چیرۆکی موسا و خزر، خودا پێغەمبەرێک و خۆشەویستێکی خۆی دەنێرێت بۆ ئەوەی دیوارێک ڕاست بکەنەوە کە هیی دوو منداڵی سێوییە، چونکە باوکیان پیاوێکی چاک بووە!

دەبینن هەتا چ ئەندازەیەک خودا گرنگیمان پێ دەدات،

**خودا پێمان دەڵێت کاری چاکە بکەن و ترستان نەبێت،**

**تەنانەت لەدوای مردنیشتان منداڵەکانتان دەپارێزم،**

**ئای چەندە بێپێویستە لێمان و، ئێمەش چەندێ پێویستمان پێیەتی!**

(٩٤)

ئەو دەمەی لەگەڵ خودادا دەدوێیت، پێویستت بەوە نییە بڵێیت:

ببوورە بەم کاتە بێزارت دەکەم،

یان خولەکێک کاتی خۆتم پێ ببەخشە!

ئەو هەموو شتێک دەزانێت بەبێ ئەوەی یەک وشەش بڵێیت،

بەڵکوو ئەوەی جێی سەرنجە چیرۆکەکەت دەزانێت و،

گوێشت لێ دەگرێت،

ناڵێت ئەمە هەزار جار ئەمەمان بۆ باس بکەیت،

**لەگەڵ خودا، هەرچی باس بکەیت هەست بە شەرمەزاری ناکەیت!**

***

(٩٥)

﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ﴾

واتە: هەرچی لای ئێوەیە تەواو دەبێت و نامێنێت، بەڵام ئەوەی لای خوایە هەر دەمێنێت!

***

(٩٦)

پرسیار: لەبارەی خوداوە بۆم بدوێ؟!

وەڵام: دەبینێت سەرپێچی دەکەیت، وا لە دڵت دەکات هەست بە پەشیمانی بکەیت. دواتر داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەیت، ئەویش لێت خۆشدەبێت، دواتر لێشت ڕازی دەبێت و، خراپەکانیشت بۆ دەگۆڕێت بە چاکە!

***

(٩٧)

ئەو کەسەی شەونوێژ دەکات،
خودا نوورێک دەخاتە دەموچاویەوە،
هەموو موسڵمانێک خۆشیدەوێت.
ئەو کەسەی یەکەمجاریەتی دەیبینێت، دەڵێت:
ئەو کەسەم خۆشدەوێت!

***

(٩٨)

مانگ دەگیرێت نوێژ دەکەین،

خۆر دەگیرێت نوێژ دەکەین و،

وشکەساڵیش دەبێت نوێژ دەکەین!

نوێژ گرفتەکانی گەردوون چارەسەر دەکات،

چۆن چارەسەری گرفتەکانی تۆ ناکات!

***

(٩٩)

﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾

واتە: پەروەردگارمان، بەڕاستی تۆ دەزانی بە هەرچی دەیشارینەوە و هەرچی دەری دەبڕین، هیچ شتێ لای خوا شاراوە نییە نە لەزەوی و نە لەئاسماندا.

گومانت وایە، شتێک هەیە لە خودا شارەوە بێت!

تەنانەت ئەو شتەی نەتدرکاندووە خودا دەیزانێت.

هەموو ئاوات و خەمەکانت، شتێکە لە زانستە فراوانەکەی.

ئارام بە!

***

(١٠٠)

بە دوعا دەجەنگێم و،

بە ئیزنی خودا سەردەکەوم.

***

(١٠١)

هەر دەرگایەک سێ جار لێت دا و بۆت نەکرایەوە، بگەڕێوە!

ئیللا دەرگای دوعا نەبێت،

ئالودەی لێدان لەو دەرگایە ببە!

***

(١٠٢)

ئەو دەمەی خودا سەرەتایەکی نوێت پێ دەبەخشێت،

هەڵە کۆنەکانت دووبارە مەکەرەوە!

***

(١٠٣)

ئەو نارەحەتی و گرفتەی کە ڕووی کەسانی چواردەورتی دەرخست،

تەنها ڕێکەوتێک نەبوو،

بەڵکوو دیارییەک بوو لەلایەن خوداوە بۆ تۆ!

***

(١٠٤)

پیاوێک هاتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ و وتی:

گەر تاوانێک بکەم خودا لەسەرمی دەنووسێت؟

فەرمووی: دەینووسێت.

وتی: گەر تەوبەم کرد؟

فەرمووی: دەیسڕێتەوە.

وتی: گەر گەڕامەوە سەری؟

فەرمووی: دەینووسێت.

وتی: گەر تەوبەم کرد؟

فەرمووی: دەیسڕێتەوە.

وتی: گەر گەڕامەوە سەری؟

فەرمووی: دەینووسێت.

وتی: گەر تەوبەم کرد؟

فەرمووی: دەیسڕێتەوە.

وتی: هەتا چ کاتێک دەیسڕێتەوە؟

فەرمووی: **هەتا ئێوە لە داوای لێخۆشبوون بێزار نەبن، خودا لە لێخۆشبوون بێزار نابێت!**

(١٠٥)

پەروەردگارا،

یەعقوب هانای بۆ بردیت،

لە خەم ڕزگارت کرد و، بینایی و کوڕەکەیت بۆ گەڕاندەوە.

نوح داوای لێ کردیت و، لە ناڕەحەتی ڕزگارت کرد.

ئەیوب داوای لێ کردیت و، لە نەخۆشییەکەی ڕزگارت کرد.

یونس داوای لێ کردیت و، لە تاریکی ڕزگارت کرد.

زەکەریا داوای لێ کردیت و، لەدوای بێئومێدبوون یەحیات پێ بەخشی.

ئیبراهیمت لە ئاگر ڕزگار کرد.

پەروەردگارا،

گەر سزام بدەیت، شایەنی سزام.

گەر وەک ئەوانیش ڕەحمم پێ بکەیت،

ئەوە هەر لە بەخشندەیی و ڕەحمەتی تۆ دەوەشێتەوە!

خودایە لە ناڕەحەتییەکانم ڕزگارم بکە.

(١٠٦)

﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾

واته: گەر نیعمەتەکانی خوا بژمێرن، بۆتان ناژمێردرێن، بەڕاستی ئادەمی زۆر ستەمکار و سپڵەیە.

﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾

واته: ئەگەر نیعمەتی خوا بژمێرن، ناتوانن بیانژمێرن، بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە.

ئایەتی یەکەم: بە مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ خودادا کۆتایی هات!

ئایەتی دووەم: بە مامەڵەی خودا لەگەڵ مرۆڤدا!

خودا چەندێ مەزن و میهرەبانە و، مرۆڤیش چەندێ سپڵە!

پاک و بێگەردی بۆ تۆ خودایە.

***

(١٠٧)

پەروەرێنە، تۆ بەو شێوەیەی کە دەمەوێت،

ڕێنوێنیم بکە،

بۆ ئەوەی بەو شێوەیە بم کە دەتەوێت.

***

(١٠٨)

سوورەتی عەلەق بە (بخوێنە) دەست پێ دەکات و،

بە (سوجدە ببە و نزیک بەرەوە) کۆتاییی دێت.

کەوایە پێویستە خوێندن و خوێندنەوەت، بۆ ئەوە بێت کە لە خودا نزیک ببیتەوە، باشتر و گوێڕاڵەتر بیت و، پەیوەندیت لەگەڵ خودایا باشتر بێت....

***

(١٠٩)

خودایە بمبوورە،

ئەو دەمەی سوجدەت بۆ دەبەم و لە ناخمدا هەزارەها قسە هەیە.

ئەو دەمەی بە گومانەوە ڕووت تێدەکەم.

ئەو دەمەی نوێژ دەکەم و نوێژەکەم وەک پێویست نییە.

ئەو دەمەی بەهۆی بڕیارەکانتەوە دەگریم.

خودایە، بمبوورە گەر ئارامیم لێ بڕا،

دەستم بگرە و بە جوانترین شێوە بمگەڕێنەوە!

***

(١١٠)

خاترجەم بە،
سارێژکردنی خودا، زاڵ دەبێت بەسەر برینەکانتدا!

***

(١١١)

بەخششی خودا دوا دەکەوێت، بۆ ئەوەی زیاتر دوعا بکەیت.
گەر ڕاستەوخۆ دوای دوعاکانمان وەڵاممان بدرانایەتەوە،
کەسمان هەستمان بە چێژی دوعا نەدەکرد،
هەستمان بە چێژی موناجاتکردن لەگەڵ خودادا نەدەکرد و،
هەستمان بە گومانی باش بردن بە خودایش نەدەکرد.

***

(١١٢)

﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ

وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾

هەر کەسێک چاکە بکات ئەوە (لە ڕۆژی دواییدا) دە ئەوەندەی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە، هەر کەسێکیش خراپە بکات ئەوە تۆڵەی لێ ناسێنرێت، تەنها بە وێنەی خۆی نەبێ و ئەوانە ستەمیان لێ ناکرێ.

***

(١١٣)

ئازارێک بوو بەرگە نەدەگیرا،

ئەوە دەزانم،

بەڵام خودایە خۆت ئاگات لێی بوو،

ئەوەش بەسە!

***

(١١٤)

﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾

ئەی موحەممەد بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەییی خوا، چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەوە لێبوردەی بەبەزەیییە.

(١١٥)

دوور لەوەی ئاواتەخوازم بچمە بەهەشت و دەترسم بچمە دۆزەخەوە.

بەڕاستی حەز دەکەم خودا ببینم...

دەمەوێت ئەو زاتە ببینم کە هۆکاری شادوومانیمە.

دەمەوێت ئەو زاتە ببینم کە لە ناڕەحەتییەکان ڕزگارم دەکات.

ئەو زاتەی دالْدەی دام و پشتیوانم بوو،

لەو دەمەی هەمووان پشتیان تێ کردم.

ئەو زاتەی..................

خودایە بێبەشمان نەکەیت لە تەماشاکردنی ڕووی پیرۆزت.

***

(١١٦)

خودایە لای خۆت ماڵێکم بۆ بونیاد بنێ،

سێبەرەکەی عەرشەکەت بێت و،

ڕووناکییەکەی ڕووی خۆت.

لەگەڵ خۆشەویستانمدا کۆمبکەیتەوە.

خودایە خۆشەویستیی خۆت بخەیتە دڵمەوە،

لە خۆتم نزیک بکەرەوە و،

بە خۆتەوە قاڵم بکە.

خودایە یارمەتیم بدە و لێم ڕازی بە!

***

(١١٧)

گەر زۆر حەزت دەکرد شتێک بەدەست بهێنیت،

سوجدە ببە و بڵێ:

**پەروەردگارا، من ئەو شتەم خۆشدەوێت،**

**توانای خۆتم نیشان بدە لەو شتەدا.**

***

(١١٨)

ئەرێ لاواز و بێئومێد دەبیت،

لە دەمێکدا خودا هاوکار و پشتیوانتە؟!

(١١٩)

خودا بە جۆرێک دەمانپارێزێت،
کە ئێمە لێی تێناگەین.

***

(١٢٠)

"تاڵی ئارامگرتن ئازارت دەدات،
لێ ئەو دەمەی قەرەبووی خودا دێت،
ئەوەت لە یاد دەچێت کە ئازاری داویت."

***

(١٢١)

- لە دوعاکانتدا بێبەشم مەکە!
- کەست دیوە دڵی خۆی لە یاد بکات؟!

***

(١٢٢)

﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾

ئینجا بەپەلە بەرەو لای خوا بڕۆن!

***

(١٢٣)

مەڵێ مەحاڵە ئەوە بەدەست بهێنم کە دەمەوێت!

زەکەریا ئێسکەکانی پووکا بوونەوە،

سەری سپی بووبوو،

خێزانی پیرەکێک بوو کە لە منداڵبوون چووبوەوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا،

زەکەریا بەتەواوی متمانەوە،

داوای لە خودا کرد کە منداڵی پێ ببەخشێت.

خودا پێی بەخشی!

**بیرت بێت، هیچ شتێک لای خودا مەحاڵ نییە!**

***

(١٢٤)

زۆر لە دەرگای خەڵکیم دا، تەنها هەژاری و زەلیلیم زیادی کرد.
بە زەلیلییەوە لە دەرگاکەی تۆم دا و، عیززەتم زیادی کرد!

***

(١٢٥)

ئەو دەمەی لە دڵەوە سامان دەبەخشیت،
گیرفانتی پێ پڕ دەکەیت.

***

(١٢٦)

گەورەترین نیشانەی گومانی باش بردن بە خودا،
بەردەوامبوونتە لە دوعاکردن،
گەرچی وەڵامدانەوەت دواکەوتووە!

(١٢٧)

پەناگەی مرۆڤ.....پەروەردگاریەتی.

***

(١٢٨)

خودایە، زۆر گریام و چەندین وردەکاریم وت کە هەموویت دەزانی، کۆمەڵێ ئازارم باس کرد کە ئاگات لێیانە، دڵم هەڵدایەوە و زمانم هاتە گۆ بۆت، هێمام بۆ شانم کرد و پێم ڕاگەیاندیت باری سەرشانم قوورسە، داوام لێ کردیت خەونەکانی ناخم بەدی بهێنیت، پەنام بۆ هێنای بە ناوە مەزنەکانت، خودایە بە زوویی وەڵامم بدەرەوە.

***

(١٢٩)

**ئەو برینەی قورئان سارێژی دەکات،**
**سارێژبوونەکەی زۆرترین ماوە دەخایەنێت.**

***

(١٣٠)

دەترسم خودا بەهۆی تاوانێکمەوە سزام بدات و،
لە شەونوێژ بێبەشم بکات.
هەر بۆیە وا مەزانە بە ویستی خۆت هەستاویت بۆ شەونوێژ،
بەڵکوو خودا هەڵیبژاردوویت و خۆشیدەوێیت.

***

(١٣١)

﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا﴾

واتە: هانا و هاواری برد بۆ پەروەردگاری بە پەنهانی.

ئیبنو تەیمییە دەفەرموێت:

دوعاکردن بە پەنهانی بەئەدەبترە،

چونکە لای پادشاکان دەنگ بەرز ناکرێتەوە.

***

(١٣٢)

براکانی یوسف وتیان: ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾

بێگومان پارێزگاری لێ دەکەین و ئاگامان لێی دەبێت.

یەعقوب پێی وتن: ﴿فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا﴾

کەواتە خوا چاکترین پارێزەرە!

ئەوان یوسفیان ون کرد و خودا پاراستی،

متمانەت بە خودا هەبێت و، ئاسوودە بە.

(١٣٣)

قەرەبووی خودا،

ئەو تاڵییەت بیر دەباتەوە کە چەشتووتە....

***

(١٣٤)

**- ئەو دەمەی هیچ پەنایەک شک نابەم، بەرەو کوێ بچم؟**

**- بەرەو لای خودا!**

***

(١٣٥)

﴿وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٌ﴾

واتە: چاوەکانی سپی هەڵگەڕا و ئاوی سپی تێزا و بینینی نەما لە ئاخ و داخ و خەفەت و ئێشدا، هەر خەم و پەژارەی خۆی دەخواردەوە.

هەتا باسی ئازارەکانمان نەکەین،

کەس پێی نازانێت،

لێ خودا ئاگای لە ئازارەکانتە،

گەرچی بێدەنگیش بیت!

***

(١٣٦)

بۆ بەختی دەگریا،

میهری خودا ڕژا بەسەریدا،

دەستی کردەوە گریان،

بەهۆی ئەوەی گومانی خراپی بە خودا بردووە!

(١٣٧)

نەخۆش دەکەویت، چونکە دەیەوێت لێت خۆشبێت.

تووشی بەڵا دەبیت، چونکە دەیەوێت ڕەحمت پێ بکات.

تووشی خەفەت دەبیت،

چونکە دەیەوێت هەست بە چێژی دەروولێکردنەوە بکەیت.

هەرگیز میهری خودات لێ نابڕێت!

***

(١٣٨)

گەر بینیت خەڵکی لە کاتی نارەحەتیدا لێت دووردەکەونەوە،

بزانە خودا دەیەوێت خۆی کارەکەت بەڕێوەببات!

- شەعراوی

(١٣٩)

کە لە قورئان دابڕاویت،

لە نوێژدا تەمبەڵی دەکەیت،

بێپێویستیت لە شەونوێژ،

بەخشینت بەلاوە سەختە،

زمانت گیرە بۆ یادی خودا،

ئەی لە چ دەرگایەکەوە چاوەڕێی دەروولێکردنەوەیت!

•••

(١٤٠)

بۆچی دەبێت چاوەڕێی گرفتێک بین هەتا بمانگەڕێنێتەوە بۆ لای؟

یان بەلایەک ناوی ئەومان بیربخاتەوە؟

یان بە ڕووداوێک بگەڕێینەوە بۆ مزگەوت؟

ئەرێ خودا شایستەی ئەوە نییە،

بەبێ بەلا و نارەحەتییەکان، ملکەچی بین و پەنای بۆ ببەین!

•••

(١٤١)

دوودڵ مەبە،

خودا قەرەبووی هەموویت بۆ دەکاتەوە،

چونکە لە دەمێکدا ڕازی بوویت کە ڕازیبوون تێیدا ئاسان نەبوو.

***

(١٤٢)

خودایە،

کۆشش دەکەم بۆ ئەوەی پیس و خراپ نەبم،

هەوڵدەدەم بچمە ڕیزی کەسە چاکەکانەوە،

یارمەتیم بدە!

***

(١٤٣)

بەشەرمەوە نهێنییەکانمان لە خەڵکی سەر زەوی دەشارینەوە،
دواتر بە یەقینەوە بۆ ئاسمانی باس دەکەین!

***

(١٤٤)

کە خودا ویستی لێبوو خراپەیەکت لێ دووربخاتەوە،
وات لێ دەکات خراپەکە نەبینیت،
یان وا لە خراپەکە دەکات ڕێی تۆ نەزانێت،
یان واتان لێ دەکات بە یەک بگەن و لە یەکتری جیاببنەوە،
بەبێ ئەوەی خراپەکە زیانت پێ بگەیەنێت!

***

(١٤٥)

خەیاڵی ئەوە بکە،

خودا تەماشات بکات و ببینێت،

قاڵی بە سارێژکردنی برینی کەسەکانەوە،

لە دەمێکدا لە هەمووان زیاتر بریندارتریت!

وەڵڵاهی، خودا سارێژی هەموو برینەکانت دەکات و ڕازیت دەکات.

***

(١٤٦)

نه كەس حەسوودی پێ بردووم،

نه چاویان لێ داوم،

هەموو شتەكە ئەوەیە،

كەمتەرخەمم لە یادی خودا و،

ڕۆچوومە لە تاواندا.

***

(١٤٧)

خودا،

هەموو گرفتەكانت دەگۆڕێت بۆ چارەسەر،

هەموو ئاواتەكانت دەگۆڕێت بۆ حەقیقەت،

هەموو خەونەكانت دەكاتە ڕاستی،

هەموو ئەسرینەكانت دەگۆڕێت بۆ زەردەخەنە....

***

(١٤٨)

ئەو دەمەی زانیم خودا بیسەری ڕازەکانمە،

گریام!

***

(١٤٩)

لە سکی نەهەنگدا هیوایەک هەبوو،

ئەی تۆ بۆ بێهیوایت؟!

***

(١٥٠)

بە سەرسوڕمانەوە تەماشای ئەو دیمەنەم دەکرد،

کە تێیدا هەوڵی تیرۆرکردنی عائیز قەرەنی دەدرێت لە فلیپین.

چۆن کەسەکە لە دووریی یەک مەترەوە،

شەش فیشەک دەنێت بە شێخەوە، بەبێ ئەوەی هیچ بەربەستێک لە نێوانیاندا هەبێت، تەقەکەرەکەش کەسێکی لێهاتوو دیارە، بەڵام دواتر شێخ بە ساغ و سەلامەتی، لەو ڕووداوە، ڕزگاری دەبێت!

لە یادمە چۆن یەک فیشەک، لە دوورەوە،

ژیانی جۆن کەنەدیی بە کۆتا هێنا،

لە دەمێکدا ترۆمبێلەکەی دەجوڵا و پاسەوانەکانیشی لە دەووری بوون!

ئەم ڕووداوە وانەیەکی تەواوە، بەڵکوو کتێبێکە و لە چەندین بەش پێکهاتووە لە واتای ناوی خودا (الحفيظ)(پارێزەر)!

- عەلی جابر فەیفی

(١٥١)

**بە گریانەوە دەچیتە خزمەتی و،**
**بە ئارامی و ڕازیبوونەوە دەگەڕێیتەوە،**
**چونکە ئەو خودایە.**

***

(١٥٢)

بە پێشنوێژی مزگەوتەکان بڵێن،
زۆر لە سوجدەدا بمێننەوە،
دڵەکانمان ماندوون و قسەمان زۆرە لەگەڵ خودادا!

***

(١٥٣)

گەر لە دڵتدا چڵێک پووکایەوە،
سبەینێ خودا لە جێگەیدا دارستانێک دەڕوێنێت،
ئارام بە!

***

(١٥٤)

گەر لە هەموو لایەکەوە چاودێریی خودا دەورت نەدا،
لەناو دەچیت،
ژیان کێڵگەیەکە پڕە لە نەخۆشی و پلانگێڕی و ماندوویی،
بەبێ چاودێریی خوداش، ئەو دڕندانە قوتت دەدەن!

***

(١٥٥)

ئەو دەمەی داوای شتێک لە کەسێک دەکەیت و،

دەڵێت: باشە، بەسەر چاوم!

زۆر دڵخۆشدەبیت.

خەیاڵ بکە خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾

واتە: تۆ لەژێر چاودێریی ئێمەدایت!

***

(١٥٦)

پێی وت ئەم هەموو دڵنیاییەت لە کوێ بوو؟

هێمای بۆ ئاسمان کرد و پێکەنی.....

***

(١٥٧)

مووسای شیرەخۆرە، لەوپەڕی لاوازیدابوو، نەخنکا!

فیرعەون لەوپەڕی توانایدابوو، لە نیلدا خنکا.

کارەکانت ڕادەستی خودا بکە و،

ئارام بە.

تەنها ئەوە دێتە ڕێت کە بۆت نووسراوە.

***

(١٥٨)

**کە لەتێک خورما لە ئاگر دوورمان دەخاتەوە،**
**بەخشینیش تووڕەیی خودا خامۆش دەکات،**
**ڕۆژوو حەفتا پاییز لە ئاگر دوورمان دەخاتەوە،**
**دەستنوێژ دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکانمان،**
**چاکەیەکیش یەک بە دە زیاترە،**
**بۆچی باوەڕمان وایە بەهەشت هێندە دوورە؟**

***

(١٥٩)

لەدوای ئەوەی هەموو قورئانی پیرۆزم لەبەر کرد،
دڵنیابووم لەوەی ئیدی دەتوانم هەموو شتێک ئەنجام بدەم و،
سەرکەوتووش بم تێیدا،
چونکە توانیم مەزنترین کار ئەنجام بدەم!

***

(١٦٠)

پەروەرێنە،

وام لێ بکە چاوەڕێی شتێک نەکەم کە نایەت و،

دڵم وابەستەی شتێک نەبێت کە هیی من نییە.

***

(١٦١)

﴿سَيَجۡعَلُ ٱللَّهُ بَعۡدَ عُسۡرٍ يُسۡرًا﴾

لەدوای هەموو ڕۆژە سەختەکان،

ڕۆژانێک چاوەڕێتن پڕن لە ئاسوودەیی و بەختەوەری،

ژیانت پڕ دەکەن لە کامەرانی.

ئەمە بەڵێنی خودایە.

***

(١٦٢)

خودای گەورە دەفەرموێت:﴿أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ﴾

پیتی یائی(دعاني) سڕاوەتەوە، لە دەمێکدا هیچ هۆکارێکی نەحویی نییە بۆ سڕینەوەی لێرەدا، هەندێ لە موفەسیرەکان وتوویانە:

وەڵامدانەوەکە هێندە خێرایە پیتی کۆتاییی وشەکە سڕاوەتەوە!

لە بەرانبەردا، لە ئایەتی ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وشەی (أشكوا) ئەلیف لەدوای واوە هاتووە، لە دەمێکدا ڕێساکان ڕێگەنادەن بە نووسینی ئەلیف لێرەدا، موفەسیرەکان ڕاڤەیەکی نازداریان کردووە و وتوویانە: سکاڵاکەی هێندە گەورە بووە، سەری کێشاوە بۆ ئەوەی لە وشەکە زیاد بکرێت!

***

(١٦٣)

گەر ستەمت لێ کراوە، لە پێش تۆدا ستەم لە یوسف کراوە!

گەر هەژاریت، لە پێش تۆدا عیسا هەژار کەوتووە!

گەر شاربەدەر کراویت، لە پێش تۆدا موحەممەد شاربەدەر کراوە!

گەر منداڵەکەت خراپە، لە پێش تۆدا نووح منداڵی خراپی هەبووە!

گەر باوکێکی خراپت هەیە، لە پێش تۆدا باوکی ئیبراهیم خراپ بووە!

گەر خێزانت لاسارە، لە پێش تۆدا خێزانی لوط لاسار بووە!

گەر مێردەکەت خراپەکارە، لە پێش تۆدا مێردی ئاسیا خراپەکاربووە!

لە پێش تۆدا خودا ئەمانەی تاقیکردووەتەوە،

بۆ ئەوەی بزانیت دونیا شوێنی تاقیکردنەوەیە و،

لە ڕۆژی دواییدا هەمووان تاک تاک دەچنەوە بەردەم خودا،

مەهێڵە هیچ کەسێک لە نێوان خۆت و خودادا بوەستێت!

***

(١٦٤)

﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾

خودا شیفابەخشە،

بەبێ هۆکار شیفات دەدات،

بە لاوازترین هۆکار شیفات دەدات،

بە نامۆترین هۆکار شیفات دەدات،

بە شتێک شیفات دەدات کە بە هۆکاری نازانیت،

بەبێ هۆکار شیفات دەدات!

***

(١٦٥)

ئەو دەمەی هەستت کرد ژیانت لە مەترسیدایە،
یان نەخۆشی هەڕەشە لە تەندروستیت دەکات،
یان سەروەتەکەت نزیکە لە لەدەستدان،
یان نزیکە خۆت لەدەست بدەیت و وێڵ و گومڕا بیت،
ئەوا پێویستت بەوەیە بزانیت یەکێک لە ناوەکانی خودا (الحفیظ)ە،
پێویستە لەسەرت ئیمانت بەو ناوە مەزنە نوێ بکەیتەوە،
ئێستا کاتێکی گونجاوە بۆ ئەوەی لەو ناوە ڕابمێنیت و،
بیری لێ بکەیتەوە.

***

(١٦٦)

ئەو دەمەی خودا ویستی یوسف لە زیندان دەربکات،
دیواری زیندانەکەی نەڕووخان،
فەرمانی نەکرد فریشتەیەک ڕووحی ستەمکارەکان بکێشێت،
فەرمانی نەکرد هەورەبروسکە قوفڵەکە بکاتەوە،
تەنها وایکرد پاشا خەونێک ببینێت،
ببێتە هۆکارێکی شاراوە و، یوسف سوودی لێ وەربگرێت و،
لە زیندان ڕزگاری بێت!

***

(١٦٧)

ئەو دەمەی خودا دەیەوێت بزانیت،
خودا لەسەرووی عەرشەوەیە،
بە هەمان شێوە دەیەوێت بزانیت،
کە لە شادەماری دڵت نزیکترە لێتەوە!
﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ﴾

خودا
بیسەری گفتەکانتە،
بینەری ڕەفتارەکانتە و،
هیچ شتێکیشی لێ شاراوە نییە!

***

(١٦٨)

﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾

واتە: ئینجا ئادەم چەند وتەیەكی لە پەروەردگاریەوە وەرگرت، ئەویش لێی گیرا كرد، بەڕاستی هەر ئەو گیراكەری میهرەبانە.

تەنانەت لەدوای ئەنجامدانی تاوانیش،

بەخششی خودات لێ نابڕێت.

لەدوای تاوان،

لە ناختەوە گوێت لە دەنگی تەوبە دەبێت!

***

(١٦٩)

**ئەو دەمەی دەستەوسانی لە باسکردنی خەمەکانت،**

**نازانیت چۆن نارەحەتییەکانت باس بکەیت،**

**ئەوا بڵێ،**

﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ﴾

**پەروەردگارا، بەڕاستی تۆ دەزانی بە هەرچی دەیشارینەوە و هەرچی دەری دەبڕین!**

***

(١٧٠)

**گەر بەندە وتی:** ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾

**خودا دەفەرموێت: بەندەکەم سوپاس و ستایشی کردم.**

**دەزانیت چەندێ سوپاسی کەسەکان دەکەین،**

**بەڵام نە هەستی پێ دەکەن، نە پێزانینیان هەیە بۆی،**

**هەر بۆیە قاڵ بە بە سوپاس و ستایشکردنی خوداوە!**

***

(١٧١)

﴿أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾

واتە: بەڕاستی دووچاری زیان و ئازار و نەخۆشی بوومە، تۆش میهرەبانترینی میهرەبانانیت.

ئەو دەمەی لە قوڵاییی ناڕەحەتی و ئازاردایت،
ئەو دەمەی ژیان لەسەرت قورس بووە،
ئایا دەتوانیت بە تەواوی یەقینەوە بڵێی،
پەروەرێنم میهرەبانترینی میهرەبانانە!
گەر بەو شێوە بێت،
مژدەت لێ بێت بەوەی خودا بەم نزیکانە دەرووت لێ دەکاتەوە!

***

(١٧٢)

﴿وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ﴾

واتە: زانییان هیچ پەناگەیەک نییە لە سزای خوا، مەگەر پەنای خۆی.

لەوەیە بێزاربیت هێندە باسی خەمەکانت بۆ هاوڕێکانت کردبێت،

لەوەیە پەیت بەوە بردبێت، کە هیچیان بۆ ناکرێ بۆت.

ئێستا کاتی ئەوەیە خەمەکانت بۆ خودا باس بکەیت،

کاتی ئەوەیە پەنا ببەیتە تاکە پەناگەت،

کاتی ئەوەیە دوعا بکەیت!

***

(١٧٣)

﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ﴾

نووح هاواری کردە پەروەردگاری و وتی:

بەڕاستی بێدەسەڵاتم دەی تۆ یارمەتیم بدە.

**لەوەیە چارەسەری گرفتەکانت،**

**بە مەحاڵ و دوور و سەخت بزانیت،**

**بەڵام لەحەقیقەتدا تەنها دوعاکردن لەنێوانتاندایە!**

***

(١٧٤)

گومانی باش بە حاجیانی ماڵی خودا دەبەن،

داوای دوعای خێریان لێ دەکەن،

بەختەوەری بۆ ئەو کەسەی،

گومانی باش بە خودای حاجییان دەبات و، داوا لەو دەکات!

(١٧٥)

ئەو دەمەی هەڵە بەرانبەر کەسێک دەکەین،
شەرم لە بینینی دەکەین و،
خۆمانی لێ دەشارینەوە.
ئەوە تەنها خودایە لەدوای ئەنجامدانی تاوان و هەڵە،
بە گەڕانەوەت دڵخۆشە،
دڵخۆشە بە تەوبەکردنت و،
پێشوازیت لێ دەکات.

***

(١٧٦)

﴿وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ﴾
واتە: لە سۆزو میهرەبانی خودا نائومێد مەبن.

**خەمەکانت، بە بڵاوکردنەوەی گەشبینی چارە بکە،**
**یەعقوب زۆر خەمبار بوو،**
**لێ هەر متمانەی بە خودای خۆی هەبوو،**
**باسی بەهیوابوون و متمانەبوونی بە خودا دەکرد!**

(١٧٧)

﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا
وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ﴾

واتە: جا ئەوەی لە خوا بترسێت و پارێزکار بێت، ئەوە خوا دەرووی لێ دەکاتەوە، لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و خۆی پێی نازانێت.

تەقوای خودا، سوودی بۆ دونیا و قیامەتت دەبێت،
دوورکەوتنەوەت لە حەرامکراوەکان لەبەر خودا،
هۆکارێکە بۆ ئەوەی خودا دەرووی خێرت لێ بکاتەوە،
لە هەموو ناڕەحەتییەک ڕزگارت بکات،
دواتر دەرگایەکە لە دەرگاکانی ڕۆزی،
تەقوای خودا بازرگانییەکە هەرگیز زەرەر ناکات.

•••

(١٧٨)

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ﴾

واتە: پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هانا و هاوار بۆ من بهێنن؛ ئەوە من دوعا و نزاتان گیرا دەکەم.

گەر کەسێک پێت بڵێ،

هەرچیت پێویست بوو بە خۆم بڵێ،

زۆر دڵخۆش و بێخەم دەبیت!

**خەیاڵ بکە،**

**پەروەردگاری جیهانیان فەرموویەتی،**

**هەرچیت پێویستە بە من بڵێ و،**

**تەنها لە دەرگای من بدە!**

***

(١٧٩)

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾

واته: ئینجا دەستەکانی بەرز کردەوە و وتی: پەروەردگارە، ستەمم لە خۆم کرد، لێم ببوورە و بمبەخشە، جا خوای میهرەبانیش لێی خۆش بوو، بێگومان ئەو زاتێکی لێخۆشبوو و میهرەبانە.

تەوبەی کرد،

ددانی بە تاوانەکەیدا دانا،

داوای لێخۆشبوونی کرد،

خوداش لێی خۆشبوو!

کەواتە، تەوبە بکە و داوای لێخۆشبوونی لێ بکە،

با تەوبەکەت وەربگرێت و لێت خۆش بێت.

***

(١٨٠)

خەڵکی زۆر لەوە بێتواناترن،

زیانێکت پێ بگەیەنن کە خودا ویستی لێ نییە!

سوودێکت پێ بگەیەنن کە خودا ویستی لێ نییە!

ئەو کەسەی ڕۆزیی خۆی نادات،

لەوە بێتواناترە ڕۆزیی تۆ بدات.

ئەوەی ژیانی خۆی بەدەست نییە،

لەوە بێتواناترە داوای ژیانی لێ بکەیت.

هەر بۆیە دڵت وابەستە بکە بە خوداوە!

***

(١٨١)

﴿وَإِذ يَرفَعُ إِبراهيمُ القَواعِدَ مِنَ البَيتِ وَإِسماعيلُ

رَبَّنا تَقَبَّل مِنّا إِنَّكَ أَنتَ السَّميعُ العَليمُ﴾

بە یاد بهێنن ئەو دەمەی ئیبراهیم پایەکانی کەعبەی بەرز دەکردەوە لەگەڵ ئیسماعیلدا، دەیانوت: پەروەردگارا، ئەم کارەمان لێ وەربگرە و لە ڕیزی چاکەکانماندا تۆماری بکە، چونکە بەڕاستی تۆ خوایەکی زۆر بیسەر و زانایت.

**ئەو دەمەی لە کاری خێردا ڕۆچوویت،**
**نزا بکە،**
**ساتی وەڵامدانەوەیە.**

***

(١٨٢)

﴿لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ إِنَّا مُنَجُّوكَ﴾

واتە: مەترسە و غەمت نەبێت بێگومان ئێمە ڕزگارت دەکەین.

خودا خۆڕاگرییەکەت دەبینێت،

دڵشکاوی و خەمبارییەکەت دەبینێت،

دەبینێت لەپێناوی ئەودا خۆڕاگربوویت،

مەترسە،

خەمبار مەبە،

خودای گەورە ڕزگارت دەکات!

***

(١٨٣)

﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾

واتە: ئا بەو شێوەیە دەسەڵاتمان دا بە یوسف و، جێگیر و پایەدارمان کرد لە خاکی میسردا.

خودای گەورە پێت ڕادەگەیەنێت کە،
بەپێی سەرەتاکان بڕیار لەسەر هیچ شتێک نەدەیت،
چونکە کۆتایی سەربوردەیەکی ترە،
خۆڕاگری جوانترین عاقیبەتی هەیە.

ئەو دەمەی یوسف ئارامی گرت،
لە بوختان بۆکردن و ژێردەستەییەوە،
هەموو میسری بۆ کەوی بوو،
بوو بە عەزیزی میسر!

***

(١٨٤)

﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا
وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾

واتە: جا ئەوەی لە خوا بترسێت و پارێزکار بێت، ئەوە خوا دەرووی لێ دەکاتەوە، لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و خۆی پێی نازانێت.

گومانت وایە،
ئەو دەمەی لە ترسی خودا خۆت دەگریتەوە لە حەرامکراوەکان،
خودا وازت لێ دەهێنێت؟
باش بزانە،
خودا خۆی پەیمانی پێ داویت کە،
دەرگای ڕۆزی و خێرت بۆ دەکاتەوە کە خۆت چاوەڕێت نەکردووە.
متمانەت بە خودای خۆت هەبێت.

***

(١٨٥)

﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِۖ﴾

یوسف وتی: پەروەردگارم من زیندانم لەلا خۆشەویستترە لەوەی کە ئەوان بانگم دەکەن بۆی.

بەڵاکانی دونیا سانا دەبنەوە،

ئەو دەمەی زیان لە دینەکەت نادەن.

ئەوە هەڵبژێرە کە دینەکەت دەپارێزێت،

هەرچەندە ئازاریشت دەدات،

چونکە دڵنیا بە خودا،

خۆت و دینەکەت دەپارێزێت.

***

(١٨٦)

ئایا کەسێک هەیە لەسەر ئەم زەوییەدا،

فەرمانت پێ بکات،

تەنها پشت بەو ببەستیت؟

تەنها داوا لەو بکەیت؟

تەنها پەنا بۆ ئەو ببەیت؟

هیچ کەسێکی وەها بوونی نییە،

چونکە مرۆڤەکان ناتوانن لە هەموو شتێک بتپارێزن،

ئەوە تەنها خودایە هەموو ئەوانەت بۆ دەکات.

بیرت بێت: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِرًا﴾

خودا، توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە!

***

(١٨٧)

﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾

واتە: وردە وردە بەرەو تیاچوون دەیانبەین لە کات و شوێنێکدا کە ئەوان هەستی پێناکەن و نایزانن.

سوفیانی سەوری دەفەرموێت:

هەر کاتێک خراپەیەک دەکەن،

خودا نیعمەتی تریان پێ دەبەخشێت و،

لە بیریان دەباتەوە داوای لێخۆشبوون بکەن.

ئەو دەمەی لەسەر تاوان بەردەوام بوویت،

نیعمەتیش دەڕژا بەسەرتدا و،

دڵ و زارت داوای لێخۆشبوونیان نەدەزانی،

بزانە بەرە بەرە بەرەو لەناوچوون دەچیت،

بگەڕێوە بۆ لای خودا و داوای لێخۆشبوونی لێ بکە.

***

(١٨٨)

﴿وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُواْ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ قَالَ يَٰبُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٌ﴾

ئەوسا کاروانێک هات و ئاوهێنەرەکەیان نارد ئاو بهێنێت، ئەویش چووە سەر بیرەکە و سەتڵەکەی داهێشتە ناو بیرەکەوە، کاتێک هێنایە سەرەوە لە جیاتیی ئاو یوسف هاتە دەرەوە، کاتێک کابرا بینی، وتی: خەڵکینە مژدە بێت ئەمە لاوێکە!

**ئەو دەمەی خودا دەیەوێت ڕزگارت بکات،**

**پێویستییەک لە دەروونی هەندێ کەسدا دروست دەکات،**

**بۆ ئەوەی لە سارای ناڕەحەتی و خەفەت ڕزگارت بکەن.**

***

(١٨٩)

﴿وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾

واتە: خۆگر بە لەبەرانبەر بەجێهێنانی فەرمانی پەروەردگارتەوە، دڵنیا بە کە تۆ لەژێر چاودێریی ئێمەدایت.

مرۆڤ تێڕوانینەکانی کورتمەودان،
تەنها بەشێکی دیمەنەکە دەبینێت،
تەنها ئەوە دەبینێت کە لەپێش چاویەتی،
نازانێت لەودیو کێڵگە وشکەکەیەوە،
باخ و باخات و بەهەشت هەیە،
نیعمەتی نەبڕاوە هەیە،
کە تەنها ئارامگران پێی دەگەن!

***

(١٩٠)

﴿وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَـٰأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ﴾

واتە: ئەوسا چووە کەنارێکەوە و بەدەم هەناسەی سارد و ئەسرینەوە وتی: ئەی داخم بۆ یوسفی نازدار، لە دڵم دەرناچێت یوسفی جوان خاس و خواناسم.

تەنها خودا ئەندازەی خەمەکانت دەزانێت،

تەنها خودا دەزانێت چەندێ ماندووی،

چەندێ شکاویت!

هەموو ئەوانە جەم بکە و،

لەبەردەم پەروەردگارتدا دایانبنێ.

تەنها ئەو زاتە دەتوانێت خەمەکانت نەهێڵێت،

دڵت سارێژ بکات و،

بە ئازیزانت شادت بکاتەوە.

***

(١٩١)

ئەو دەمەی خەم و گرفت لەسەر دڵت کەڵەکە دەبن،

دەبینیت توانای هیچ کارێکت نییە،

لە خەڵکی دووربکەوە،

تەنها و تەنها لەگەڵ خودا بە،

خوداش هەموو شتێکت بۆ باش دەکات!

***

(١٩٢)

لەوەیە هەر لەو ساتەی دوعات کرد،

خودا وەڵامی دابێتەوە،

بەڵام هۆکارەکانت بۆ ئاسان دەکات.

ئارام بە!

***

(١٩٣)

بەردەوام بە خۆت بڵێ،
بەڵکوو بەم کارەم بچمە بەهەشتەوە،
بەڵکوو بەم لێبووردنە بچمە بەهەشتەوە،
بەڵکوو.....
لەگەڵ ڕووداوەکانی ژیانتدا بە جۆرێک مامەڵە بکە،
کە لە خودا نزیکت دەکەنەوە،
پاشان دەبێتە هۆی چوونە بەهەشتت.

***

(١٩٤)

**ئاممان نەکەی لە یادی بکەیت،**
**کە ڕۆژێک لە ڕۆژان،**
**داوای ئەو شتانەت لە خودا دەکرد**
**کە ئێستا هەتە!**

***

(١٩٥)

پێش ئەوەی بخەویت،

لەگەڵ خودادا زۆر قسە بکە،

داوای لێخۆشبوون بکە،

کەمێک گوێ بۆ قورئان ڕادێرە،

دڵت لە پیسییەکانی دونیا پاک بکەرەوە،

لێپرسینەوە لە نەفسی خۆت بکە،

هەوڵبدە هەموو ئەوانە ببووریت کە هەڵەیان بەرانبەرت کردووە،

ئێرە شوێنی مانەوە نییە!

دواتر بەهەشتی دڵەکانت لە یاد نەچێت،

نوێژی ویترا!

***

(١٩٦)

خودا خۆشی دەوێت،

لەنێوان بەندەکانیدا هەڵتدەبژێرێت،

بۆ ئەوەی بچیت بە هانای کەسێکەوە

کە بێتوانایە و تەواو نارەحەت بووە.

دواتر خودا ڕەحمت پێ دەکات وەک چۆن ڕەحمت پێی کرد،

ئەو کەسە دەبێتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ تۆ،

هەر بۆیە کاری خەڵکی ڕاپەڕێنە،

بچۆ بە هانایانەوە،

لەوەیە لەوپەڕی پێویستیتدا، پێویستت پێی بێت!

***

(١٩٧)

ئەم قورئانە چەندێ مەزنە!

یەک سوورەت، چەندین جار دەیخوێنیتەوە،

هەر جارەو شتێکی نوێی لێوە فێر دەبیت،

سوودێکی نوێی لێ وەردەگریت.

ئەم وشانە چۆن ئەم هەموو گەنجینە مەزنانەی لەخۆگرتووە!

بە خوێندنەوە بە جۆرێک لێی دەگەیت!

بە گوێگرتن لێی بە جۆرێکی تر لێی دەگەیت!

بە لەبەرکردنی بە جۆرێکی تر لێی دەگەیت!

ئەم قورئانە چەندێ سەرسوڕهێنەرە!

ئەو زاتەی دایبەزاندوە چەندێ مەزنە!

***

(١٩٨)

**شەرمکردن لە سووربوونەوە و،**
**سەرنزمکردنەوەدا نییە.**
**شەرمکردن ئەوەیە خودا لەسەر کارێک نەتبینێت،**
**کە لەسەرتی حەرام کردووە.**

***

(١٩٩)

خودا تاقیت دەکاتەوە بە بەڵایەک،
ناتوانیت بۆ کەسی باس بکەیت،
کەسیش لە وردەکارییەکانی تێ ناگات،
بۆ ئەوەی تەنها دڵت بە خوداوە پەیوەست بێت و،
تەنها لای ئەو شەکوای حاڵی خۆت بکەیت.

***

(٢٠٠)

هاتە لام و دەستی کردە سکاڵاکردن لە حاڵی خۆی،
گومانی وابوو چارەیەکم لەلایە بۆی.
پێم وت: نوێژی عەسر وەرەوە،
لەوەیە بتبەم بۆ لای زاتێک ئەو کارەی بەدەستە.
کە هات، مۆڵەتم لێ وەرگرت پێکەوە نوێژی عەسر بکەین،
چووینە مزگەوت و نوێژەکەمان کرد.
کە هاتینە دەرەوە لە مزگەوتەکە، ماڵئاواییم لێی کرد!
وتی: ئەی نەچین بۆ لای کەسەکە؟
وتم: کێ؟؟
وتی: گرفتەکەمت لە یاد چوو!
وتم: نەخێر، بەڵام پێش چەند خولەکێک لە ماڵی زاتێک بووین،
هەموو شتێکی بەدەستە و، بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.
بۆچی داوات لەو نەکرد؟!

تاوێک تەماشای کردم، بەدەم گریانەوە بەرەو مزگەوتەکە ڕۆیشت و،
لەبەرخۆیەوە دەیوت، ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ﴾
واتە: بە جۆرێک خودایان نەناسی کە شایستەی بێت، قەدری خودایان وەک پێویست نەگرت!

(٢٠١)

- ئەو دەمەی دەڕوخێیت، چی دەکەیت؟

- سوجدە دەبەم و زۆر دەگریم.

- ئایا سوجدەکەت هیچ شکاوییەکت سارێژ دەکات؟

- لە سوجدەبردنەکەمدا، دڵم ئۆقرە دەگرێت و،

باوەڕی تەواوم دەبێت کە تەنها خودا ڕزگارم دەکات.

- جا نوێژەکەت وەردەگرێت گەر بگریت؟

- نازانم، بەڵام هێندە بەسە کە دەرفەتی ئەوەی پێداوم سوجدەی بۆ ببەم، لەم دەمانەدا تەنها ئەوم هەیە.

***

(٢٠٢)

**خودایە،**

**داوات لێ دەکەین برینەکانمان سارێژبکەیت،**

**گەرچی شایستەش نین!**

(٢٠٣)

لە سوورەتی یوسفدا سێ جار باسی (کراس) کراوە:

لە یەکەمدا هۆکاری خەفەتە،

لە دووەمدا بەڵگەی پاکیەتییە و،

لە سێیەمیشدا مژدەی دڵخۆشییە.

**ئەوەی ئیمڕۆ ئازارت دەدات،**

**لەوەیە سبەینێ هۆکاری دڵخۆشبوونت بێت!**

***

(٢٠٤)

**ڕۆژانێکت بەسەردا تێپەڕ دەبێت،**
**کە بە ئەندازەی شاخەکان لەسەرت قوورسن،**
**نەک بۆ ئەوەی خەمبار ببیت،**
**بەڵکوو بۆ ئەوەی نزیک ببیتەوە.**

***

(٢٠٥)

خودایە دڵم بێزارنەبووە لە دوعاکردن،
بەڵام تامەزرۆی وەڵامدانەوەتەوە.

***

(٢٠٦)

هەر دەمێک سوورەتی (طه) دەخوێنمەوە،

لە خۆم دەپرسم: دەبێت مووسا هەستی چۆن بووبێت،

لەو دەمەی خودا بانگی کرد و پێی فەرموو:

﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ﴾ ئەی مووسا من خودام.

"ئەدهەم شەرقاوی"

***

(٢٠٧)

لەیادی نەکەیت کە زۆر بڵێیت:

"اللهم اهدِ لي قلبي"

"خودایە هیدایەتی دڵم بدەیت"

وەڵڵاهی کە خودا هیدایەتی دڵی دایت،

هەموو شتەکانت لەلا سانا دەبێت.

***

(٢٠٨)

گومانت وایە پیاوچاکان بێ تاوانن؟

ئەوان،

تاوانەکانیان شاردەوە و ئاشکرایان نەکرد،

داوای لێ خۆشبوونیان کرد و، بەردەوام نەبوون،

ددانیان بە هەڵەی خۆیاندا ناو، پاساویان نەهێنایەوە،

لەدوای ئەوەی خراپەیان کرد، کاری چاکەیان ئەنجامدا.

ابن القیم

***

(٢٠٩)

﴿وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴾

لە پاداشتی خۆگری و ئارامگریدا بەهەشت و ئاوریشمی پێ بەخشین.

**واز لە ئارامگرتن مەهێنە،**

**هەموو شتە جوانەکان لەدوای ئارامگرتنێکی جوانەوە دێت.**

(٢١٠)

دۆخت هەرچۆنێک بوو،
گومانی باش بەخودا ببە و گەشبین بە،
ناڕەحەتییەکەی ئێستا، بە کۆتا ناڕەحەتی ژیانت بزانە.
زۆرێک لە مرۆڤەکان بەهەمان دۆخی تۆدا تێپەڕیون،
بەڵام ئێستا تەنها وەک یادگارییەک باسی دەکەن و،
بۆتە ئەزموونێک کە بەهێزتری کردون.

***

(٢١١)

بۆ ئەوەی دەروونت ئارام بێت:
پشت بەخودا ببەستە و کارەکانت تەسلیمی ئەو زاتە بکە.
ڕازی ببە و بڵێ: ئەوەی خودا دەیهێنێتە ڕێم، ئەوە خێری منی تێدایە.
گەشبین بە و بڵێ: ئەوەی دێت، لەوەی گوزەشتوە زۆر جوانترە.
خۆت ڕادەستی خودا بکە و،
بڵێ باشترین ئەوەیە کە خودا بۆمان. دیاری دەکات.

***

(٢١٢)

خودا،

باشترین و، جوانترین و، گونجاوترینت بۆ دیاری دەکات،

ئەوە دەهێنێتە ڕێت کە بۆ خۆت و ژیانت گونجاوە،

کە لەوەیە ئەو شتانە لەنێو ئاواتەکانی تۆدا نەبن.

هەربۆیە،

ئەو دەمەی خولیای شتێکت هەیە،

کاری ئەو و خۆت ڕادەستی ئەو زاتە بکە کە کارساز و کاربەجێیە،

دواتر بە ئاسوودەیی و دڵخۆشیەوە ژیانت بەڕێبکە،

سوپاسگوزاربە لەپای ئەو شتانەی هەتە.

***

(٢١٣)

خاترجەم بە،

لەژێر چاودێری خودادا ژیانت بەڕێوەدەچێت،

ئەمە بانگەشە نییە بۆ پشت دانەوە و وازهێنان لەهۆکارەکان،

بەڵکوو بۆ ئەوەیە واز لە دوودڵی بهێنیت و ئارام بیت.

(٢١٤)

**شێخ شەعراوی دەڵێت:**

**دووربکەوە لەوانەی ڕقت لێیانە،**

**موجامەلەی درۆینەی کەس مەکە،**

**لەبەر شەرمکردن ڕازی مەبە،**

**خودا ئەو نەفسەی پێ نەبەخشیویت، بۆ ئەوەی سزای بدەیت.**

***

(٢١٥)

دەستت شل بکە بۆ بەخشین،

بۆ ئەوەی پەتی نارەحەتیەکان لەسەر شانت شل ببێت،

بزانە پێویستیت بۆ بەخشین،

زۆر زیاترە لەو کەسەی پێی دەبەخشیت!

ابن القيم

***

(٢١٦)

لێت دەپرسن جوانی لەکوێ ببینینەوە؟

پێیان بڵێ: لەدڵی ئەو کەسانەی شەرم لە خودا دەکەن.

***

(٢١٧)

گەر خودا ڕێزی لێناویت بەوەی بێ پێویستیت لە خەڵکی،

ناوی خۆت لە لیستی زەنگینەکانی جیهاندا تۆماربکە،

گەرچی خواردنی ئەو ڕۆژەشت نەبوو!

***

(٢١٨)

ئەدهەم شەرقاوی دەڵێت:

پەنادەگرم بەخودا لەوەی بێ ئومێدبووبم،

بەڵام وەڵڵاهی ڕۆژەکان سەختن.

(٢١٩)

ئەو دەمەی لە ئازارەکانمان ڕادەمێنێن،

بۆمان دەردەکەوێت خراپترین شتەکان لەگەڵ خەڵکیدا هاتۆتە ڕێمان،

جوانترینەکانیش لەگەڵ خودادا بووە.

بەڵام بەردەوام لە خەڵکی نزیک دەبینەوە و لەخودا دووردەکەوینەوە.

لەلای خەڵکی بەدوای چارەدا دەگەڕێین و،

لەبیرمان کردوە دکتۆری حەقیقی لە ئاسمانە!

لەلای خەڵکی بەدوای ڕۆزیدا دەگەڕێین و،

لەبیرمان کردوە ڕۆزیدەر لە ئاسمانە!

پەنا بۆ خەڵکی دەبەین و،

لەبیرمان کردوە پارێزەرمان لە ئاسمانە!

داوا لە خەڵکی دەکەین و،

لەبیرمان کردوە بەخشەر لە ئاسمانە!

**هەمیشە خەڵکەکان شەرمەزارمان دەکەن،**

**ئ کاتێک خودا شەرمەزاری کردوین؟**

﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ﴾

له ئاینده‌دا په‌روه‌ردگارت ئه‌وه‌نده ناز و نیعمه‌تت پێ ده‌به‌خشێت،

كه زۆر پێی ڕازی ده‌بیت.

گەر ستەمت لێکراوە، لە پێش تۆدا ستەم لە یوسف کراوە!

گەر هەژاریت، لە پێش تۆدا عیسا هەژار کەوتوە!

گەر شاربەدەر کراویت، لە پێش تۆدا موحەممەد شاربەدەرکراوە!

گەر منداڵەکەت خراپە، لە پێش تۆدا نووح منداڵی خراپی هەبووە!

گەر باوکێکی خراپت هەیە، لە پێش تۆدا باوکی ئیبراهیم خراپبووە!

گەر خێزانت لاسارە، لە پێش تۆدا خێزانی لوط لاساربووە!

گەر مێردەکەت خراپەکارە، لە پێش تۆدا مێردی ئاسیا خراپەکاربووە!

لە پێش تۆدا خودا ئەمانەی تاقیکردۆتەوە،

بۆ ئەوەی بزانیت دونیا شوێنی تاقیکردنەوەیە و،

لە ڕۆژی دواییدا هەمووان تاک تاک دەچنەوە بەردەم خودا،

مەهێڵە هیچ کەسێک لەنێوان خۆت و خودادا بوەستێت!

---